# گفتوگۆیەکی زانستیانە
# لەگەڵ سەلەفیەکی مەدخەلی

(یاخیبوون لە دەسەڵاتدار ، دیموکراسی، حیزبایەتی، هەڵبژاردن)



وحيد عبد السلام بالى

وەرگێرانی
باوکی ڕۆژی



٢٠١٥م

# گفتوگۆ یەکی زانستیانە
# لەگەڵ سەلەفیەکی مەدخەلی

وحید عبد السلام بالی

وەرگێرانی

باوکی ڕۆزی

٢٠١٥م

ناوی کتێب/ گفتوگۆ یەکی زانستیانە لەگەڵ سەلەفیەکی مەدخەلی
وحيد عبد السلام بالی
وەرگێڕانی/ باوکی ڕۆزی
دیزاینی بەرگ/ حامد سەقزی
دیزاینی ناوەڕۆك/ کارزان سەعدی
چاپ/ چاپی یەکەم
چاپخانە/ چاپخانەی شەهاب ٠٧٥٠٤٤٨٣٨٦٢
تیراژ/ ٢٠٠٠ دانە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ
وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم
بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ

سورة النحل - ١٢٥

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەكی

سوپاس بۆ خوای گەورەو درودو سلاو بۆ گیانی پاك و خاوێنی پێغەمبەری خۆشەویست و یاران و شوێنكەوتوانی تا رۆژی دوایی.

خۆێنەری بەرێز: ئەم پەڕاوەی لە بەردەستە گفتوگۆیەكی زانستیانەیە لە نێوان زانایەكی سەلەفی بە ناوبانگی میسری شێخ وەحید بالی ـ خوا تەمەنی درێژ كات[1] لەگەڵ برایەكی بەرێزی ڕەوتی سەلەفیەكی مەدخەلی ـ خوا پاداشتی بداوە ـ لە سەر چوار تەوەری گرنگ و هەستیارە كە زۆر جار ئەم ڕوەتە خەڵكی پێ سەرقاڵ دەكەن:

١ـ یاخیبوون لە دەسەلاتدار.

٢ـ دیموكراسی.

---

(١) ناوی تەواوی: وەحید عبدول سەلام بالی یە، لە ساڵی(١٩٦٣ن) لە گوندی ئەحمد سولەیمانی سەر بە پارێزگای كەفری شەیخ لە كۆماری میسر لە دایك بووە؛ خوێندنی بنەڕتی تەواو كردووە و بەكالوریۆسی ئەداب لە بەشی زمانی عەربی لە ساڵی (١٩٨٥ن) وەرگرتووە وهەر لەو كاتە تەواوی قورئانی پیرۆزی لە بەر كردووە؛ سەفەری بۆ سعودیە كردووە و دوو ساڵ لە مەدینە و چوار ساڵ لە ئەبها وانەی زمانی عەرەبی وتەوەتەوە؛ بە مەبەستی بانگەواز بۆ زۆرێك لە ولآتانی وەك قەتەر و ئیمارات وبەحرەین و سوید گەشتی كردووە؛ ئەو مامۆستا و زانایانەی وانەیان پێ وتووە: ١ـ شێخ بن باز. ٢ـ شێخ موحەممەد عوسەیمین. ٣ـ شێخ ئەلبانی. زۆرێكی تر لە مامۆستایان وزانایان. خاوەنی زیاتر لە ٢٥ پەڕاوی چاپكراو و سەدان كاسیت وفیدیۆ یە لە ڕاڤەكردنی زانستە شەرعیەكان.

٣ـ حيزبايەتی.

٤ـ هەڵبژاردن.

لە ئەنجامدا و پاش گفتوگۆیەکی زانستی دوور و درێژ ئەم برایە دان بە ڕاستی بۆچوونەکانی شێخ وەحید بالیدا دەنێو پەشیمانبوونەوەی خۆی لە فیکر و بۆچوونی ڕەوتی مەدخەلیەکان ڕادەگەیەنێ و تۆبە دەکات.

شێخ وەحید بالی لە یەکێك لە مزگەوتەکان ئەم گفتوگۆیەی کە ئەنجامی داوە بە ئەمانەتەوە بۆ دەستەیەك لە قوتابیانی دەگێڕێتەوە و بە فیدیۆ تۆمار کراوە.

بۆ یەکەم جار کە تەماشام کرد و گوێم لێی بوو هەستم کرد کە زۆر گرنگە کە وەربگێڕێ بۆ سەر زمانی شیرنی کوردی، بۆ ئەوەی خۆینەرانی بەڕێز ـ بە تایبەت گەنجانی خۆشەویستی ولاتەکەم ـ لە فیکر و بیرو باوەڕێ ئەم گروپە ئاگادار بن کە غەیری هەڵگرانی ئەو ڕەوتە نەبێ کە دەستەی رزگاربوون (الفرقة الناجية) و لە سەر ڕێبازی پێغەمبەر و هاوەلانن، ئەوانی تری پێ گومڕاو وسەرلێشێوا و بیدعەچی و جەهەنمیە ـ پەنا بەخوای گەورە ـ!!.

لە وانەیە هەندێك گەنجی پابەند بە ئاین و کەم شارەزا لە زانستە شەرعیەکان فریوی هەندێك بۆچوونی ئەم ڕەوتەی خوارد بێ و کەوتبێتە داوی تۆمەت بەخشینەوە و بێ ئەدەبی بەرامبەر زانایان و بانگخوازانی ڕەوتەکانی تر، بەلام گەر وەك پاڵەوانی ئەم گفتوگۆیە بە ئینساف بێ و گوێ بۆ هەق و ڕاستی

بگـرێ و شـوێنی بکـەوێ دوور لـە دەمـارگیری و ئـارەزوو، بـە دڵنیاییەوە واز لەو بیرو بۆچوونە دەهێنێت و گشت موسوڵمانان بە برا و دۆستی خۆی دەزانێ و هەوڵی کۆژانەوەی هـیچ مۆمێـك نادات، کە لە تاریکیدا داگیرساوە، بەڵکو دوعای خێر بـۆ گشـت ڕوتەکانی تر دەکات کە پەبەندن بە ئاینـەوە و خـەبات دەکـەن بۆ چاکسازی لە وڵاتدا.

ئەپاڕێمەوە لە خوای گەورە کە پاداشتی شێخ وەحید بالی باداتــەوە و ئــەم پــەڕاوەش ببێتــە مایــەی ســودی گشــت خوێنەرێك، و ئێمە و ئەوانیش بکاتە برای ڕاستەقینە و گینـە و دووبەرەکی لە نێوان موسوڵمانان نەهێڵێ.

اللهم أرنـا الحـق حقـاً و ارزقنـا اتباعـه وأرنـا الباطـل باطلاً و ارزقنا اجتنابه. اللهم آمين.

وەرگێڕ

هەولێر ٢٠١٥/١/١٠

# گفتوگۆیەکی زانستیانە
# لەگەڵ سەلەفیەکی مەدخەلی

**دەروازە**

سوپاس و ستایش بۆ پـەروەردگاری جیهانیـان و سـوپاس بۆ خوای پاك و بێگەرد و داوای لێخۆشبوونی لێدەکەم و دروود و سـەلام لـە بەنـدە و نێـردراو ی خـوای گـەورە موحەممـەد (درووودی خوای لیَ بیَ) و لە سەر ئالَ و هاوەڵانی بەگشتی.

پەروەردگارا: زانسـتمان نیـە جگـە لـە وەی کـە تـۆ فێـرت کردووین, تەنها تۆخاوەنی دانایی و زانایی بیَ سنووری. خودایە ڕاستی بە ڕاستمان نیشـان بـدە و شـوێنکەوتنی ڕاسـتیمان پـیَ ببەخشە و بەتالَ و چەوتمان پیَ نیشان بدە و هاوکارمان بە بـۆ ئەوەی لێی دووربیین.

خودایە ئێمە نەزانین تـۆ فێرمـان کـە, لاوازیـن بـە هێزمـان کـە, تاوانبـارین لێمـان خـۆش بـە ,داوای ڕێنمـای دەکـەین ڕێنمایمان بکە، داوای هیدایەت دەکە ین هیدایەتمان بدە, هێز و توانا مان نیە تەنها بە هێز و توانای تۆ نەبیَ.

پاشان:

خۆشە ویستانی بەڕێز، برایانی قەدرگران:

باسی ئەمڕۆمان سەبارەت بە ئەم پرسە تازە یە، کە لە هەندێ و لاتانی ئیسلامی دەرکەوتووە، ئەویش پرسی ئەو برایانەمانە کە شوێنی پرۆگرامی (م. رەبیعی کوڕی هادی مەدخلی)[1] کەوتوون خوا بیپارێزی و ئاگاداری بێتو خوا گشت شوێنکەوتووانی بپارێزی[2] ، پرس وجیاوازی ئەوان لەگەڵ براکانیان کەجیاوازن لەگەڵیان، شوینکەوتەی مامۆستایانی ترن، خوا بیانپارێزی و ئاگاداریان بێ و بەرەکەت بخاتە تەمەنی هەموویانەوە و لەسەر بەندایەتی و ڕەزامەندی خۆی کۆیانکاتەوە.

---

(١) شێخ رەبیع کوڕی هادی کوڕی موحە ممەدی مەدخەلییە، لە گوندی جەرادییە سەر بە شاری سامیتە ساڵی(١٣٥١) کۆچی لە دایك بووە، لە ساڵی(١٣٨٠ك) پەیمانگای زانستی تەواو کردووە و ساڵی(١٣٨٤هـ) بەکالۆریۆسی لە جامیعە ئیسلامی لە مەدینە وەرگرتووە، پاشان لە زانکۆی مەلیك عبد العزیز بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرای هێناوە. لای زانایانی سەردمی خۆی وانەی خوێندووە لەوانە: ١ـ شێخ بن باز. ٢ـ شێخ موحەممەد شەنقیتی.٣ـ شێخ ئەلبانی. خاوەنی چەندین پەڕا و کتێبی چاپکراوە. ئێستە ڕابەری ڕەوتێکی سەلەفیە کە ناسراوە بە (ڕەوتی مەدخەلی).

(٢) ئەمە هەڵویستی زانایی خواناس و شوێنەکەوتەی ڕاستەقینەی سەلەفی ساڵحە کە لە گەڵ ئەوەی بۆچوونی لە گەڵ شێخ رەبیع جیاوازە بەلام ئەمە نابێتە ڕێگری لە دوعاکردن بۆ خۆی و شوێنکەوتوانی، ئەم هەڵوێستە بەراوردکە لەگەڵ هەڵویستی برایانی مەدخەلی لەگەڵ نەیارەکانیان! !.

خۆشەویستانی بەڕێز: بنەماکانی ئەم جیاوازیەش هەر لەکۆنەوە هەیە لە نێوان زانایانی موسولماًن و فێرخوازان و بانگخوازان بۆ لای خوای گەورە و بالاّ دەست.

ئەدە بی ڕاجیایی ئەوەی پێویستە جەختی لەسەر بکەین و ڕوونی بکەینەوە، باشترین و گرنگترین شتیّ لەسەر مەسەلەی ڕای جیایی ویژدان و ئینسافە لە هەڵسو کەوت کردن لەگەڵ کەسی موخالیفدا.

ئەگەر تۆ لەگەڵ هاوڕێکەت لە بابەتێکدا جیاواز بووی:

**کاری یەکەم:** کە دەبیّ ئەنجامی بدەی: خۆ داڕنینە لە هەموو ئارەزوویەك.

**کاری دووەم:** دەبیّ بزانی کەتۆش هەڵە دەکەیت و دەپێکی، هەنێك لەخەڵك وا گومان دەبات کە هەڵە ناکات وتەنها قسەی ئەو ڕاستە و بیّ هەڵەیە و قسەی کەسانی تر هەڵەیە. ئەمە ڕاست نیە، تۆدە بیّ بزانی هەڵەدەکەی وەك چۆن بەرامبەرەکەت هەڵە دەکات.

**کاری سێیەم:** ملکەچ بی بۆ خوای گەورە و بالاّ و داوای لیّ بکەی ڕێنمونیت بکا بۆ ڕاستی و پشتیوانیت بکات بۆ وەرگرتنی، و لەوەرگرتنی ڕاستی خۆبەزل و گەورە نەزانیت, تەنانەت با لە کەسێکەوە بیّ کە ئاستی زانستی لەتۆ کەمترە.

**کاری چوارەم:** گومانی چاك بەری بەکەسی موخالیف، کەڕاستی دەوێت و مەبەستێتی پێی بگات و مەبەستی ڕەزامەندی خوایە، وەك توش مەبەستە. بەلاّم لەوانەیە بەهەلّە ڕووی لە ڕاستی نابێ و لەوانەشە تۆش بەهەلّە بەرە و ڕاستی ڕۆشتبی.

**کاری پێنجەم:** هەرگیز سوکایەتی ولاقرتی بە بەرامبەرەکەت نەکەی لەکاتی ئاخاوتندا و ڕەخنە لە قسەکەی بگری و هەلّیبوەشێنیتەوە کە ڕەخنەی زانستی نەبی.

لەو ڕوانگەیەوە لەگەلّ هەندێك لە برایانمان کۆبوومەوە، زیاتر لەکەسێك و زیاتر لە دانیشتنێك.

وتم بە یەکێکیان: پێمان گەیشتووە کە بڕیاری بیدعەت و گومڕایت بەسەر هەندێك لەزانایانی بەرێزی میسردا داوە، ئەوانەی کەخوای گەورە قەبولّبوونی لای خەلّکی پێ بەخشیون, و کەسانێك لەسەر دەستیان هیدایەتیان وەرگرتووە, و ناوی هەندێ لەو زانایانەمان هێنا بۆی( مامۆستا موحەممەد حەسان و مامۆستا ئەبو ئیسحاق حوەینی و مامۆستا موستەفا عەدەوی و مامۆستا یعقوب) و زۆری تر لە زانایانی میسر, بە فەزلّی خودا میسر پڕیەتی لەزانایانی قەدرگران لە ئەهلی سوننەت، کەچەندین کەسی سەر لێشواو لەسەر دەستیان خوا هیدایەتی داون!.

چەندین پیاو هەبووە کە نەزری بۆ گۆڕەکان دەکرد و گەڕایەوە لای خوای گەورە و یەکتاپەرستی بیّ خەوش وخالّ لەسەر دەستی ئەوان!.

چەندین گوناهبار هیدایەت دراون لەسەر دەستی ئەوان، بەڵکو چەند لە نا موسوڵمانان لەسەر دەستی ئەوان موسوڵمان بوون!.

چەندین سوننەتیان زیندوکردۆتەوە و چەند بیدعەیان لەناوبردووە!.

جا ئەو برادەرە وتی: ئەوان گومڕا و بیدعە چین[1]!!.

پێموت: من ئێستا بەرگری ناکەم، ئینساف و ویژدان ئەوەیە کە دەرفەرتێك بە تۆ بدەین، بۆ ئەوەی باسی بەڵگەکانت بکەی سەبارەت بە گومڕایی ئەو مامۆستا و زانایانە و شوێنکەوتوانیان لە ئەهلی سوننە، پاشان ئەم بەڵگانە وەردەگرین و لە سەر تەرازوی توێژینەوەی زانستی بێلایەن دادەنێین و دەڕوانین ئایا بە ڕاستی ئەو زانایانە کەوتونەتە ناو بیدعەوە یا نە؟.

---

(١) ئەم بڕیارە سەرپێی وخێرایەت پیّ سەیر نەبیّ چونکە ـ بەداخەوە ـ یەك لەو وانانەی کە قوتابیەکانیان پیّ گۆش دەکەن بریتە لە: تۆمەت بەخشینەوە و ئەوەی لەگەڵم نەبیّ و لەسەر ڕاو بۆچوونی ئێمە نەبیّ دژ و گومڕاو وبیدەعە چیە!!. بەڵگەش ئەوەیە هەر ئەو مامۆستایانەی کە ئێستە ئەوان بە گومڕاو بیدعەچیان لە قەلم ئەدەن سەردەمێك ـ پێش ئەوەی ڕاجیایی درووست ببیّ ـ بە زانای پایە بەرز و مامۆستای فەرموودەناسان ناوزەدیان دەکردن.

ئەویش وتی: بەڵێ لێرەدا چەند خاڵێك هەیە.

وتم: فەرموو، کاغەزێك و پێنوسێکم هێنا و لە بەردەستی دانیشتم وەك قوتابی و مامۆستا.

وتی: بنووسە:

بابەتی یەکەم: یاخی بوون لە دە سەلأت.

بابەتی دووەم: دیموکراسی.

بابەتی سێیەم: حیزبایەتی.

بابەتی چوارەم: هەڵبژاردن.

منیش پێموت: تۆ لەگەڵ ئەم مامۆستایانەی ئەهلی سوننەت لەو چوار بابەتەدا جیاوازی و بڕیاری فاسق بوون و بیدعەچی و سەر لێشێواویت داون، لەکاتێکدا زانایان لەکۆن و نوێدا جیاواز بوون!.

وتی: ئەوان لەبابەتە جوزئی و فقهیەکاندا جیاواز بوون، بەڵام جیاوازی لەبنەما و بیروڕا و عەقیدە گومڕاییەکی ڕوونە[1].

پێموت: لە بەر چی؟.

وتی: چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: (إن بني إسرائيل تفرقت على ثنتين وسبعين ملة وتفترق أمتي على ثلاث وسبعين ملة كلهم في النار

---

(١) سەیرە یاخیبوون لە دەسەلأتدار و پرسی دیموکراسی و حیزبایەتی و هەڵبژاردن بەشێکە لە عەقیدە وبیرو باوەڕ تا خەڵکی لە سەر گومڕا کەین! یا شتێکی جوزئییە و ڕای جیاواز هەڵدەگرێ؟.

إلا ملة واحدة قالوا ومن هي يا رسول الله قال: ما أنا عليه وأصحابي)[1]

جا ئەهلی سوننە لەبەرنامەی پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێ) و هاوەڵانی ڕۆشتوون و هەر ئەوانیش دەستەی رزگاربوون، بەلاَم ئەوەی جیاواز بێ لەگەڵیان لە دەستەی رزگار بوو دەر ئەچێ بۆ حەفتاو دوو دەستە گومڕاکەی تر, جا ئەو مامۆستایانەی تر کە باسکران یاخیبوون لەدەسەلاَتدار و باوەڕیان بە دیموکراسی و حیزبایەتی و هەڵبژاردن هەیە و هەموو ئەمانەش لای سەلەفی سالَح نەبووە, کەواتە لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە دەرچوون و چونەتە ناو بیروباوەڕی ئەهلی بیدعە و لە حەفتاو دوو دەستە گومڕا و جەهەنمیە فەوتاوەکەی ترن.

پێموت: دەی با دەست بە گفتوگۆ بکەین و بڕوانین ئایا دەرچوون یا نە؟.

دەست بە بابەتی یەکەم بکە.

---

(١) سنن الترمذي: (٥/ ٢٦). ئەم فەرمودەیە کە ئەم برایانە کردوویانە بە یەکێك لە بنەماکانی ئاین و پێوەری بەخشنی جەکی بەهەشت و دۆزەخ قسە وباسی زۆری لە سەرە، بڕێك لە زانایان بە دروستیان داناوە و هەندێکیشان بە لاوازیان داناوە وەك ئیبنو حەزم و ئیبنول وەزیر و سەنعانی، جا گەر فەرموودەیەك بەم جۆرە جێی مشت و مڕی زانایانە، لە ڕووی سەنەد و مەتنەوە چۆن دەبێ بکرێتە بنەمایەکی عەقیدەیی بۆ هەڵسەنگاندنی بیرو باوەڕی مرۆڤەکان! !.

## بابەتی یەکەم
## یاخی بوون لە دەسەلات

وتی: بابەتی یەکەم: یاخیبوون لەدەسەلأتدار.

ئەو دەیوت و منیش لە دوایەوە دەمنوسی.

یاخی بوون لەدەسەلأتدار دروست نیە. خوای گەورە ئەفەرموێ: [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ منكم] النساء: ٥٩.

بەڵێ چەند فەرموودەیەکی زۆری باس کرد کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) هانی موسلمانان دەدات لەسەر دان بەخۆداگرتن لەسەر زوڵمی دەسەلأت، تەنانەت با ستەمیش بکات، ئەو فەرموودانە بەناوبانگن و لەبەرتانە، لەوانە: (وإن ضرب ظهرك وأخذ مالك)[1] هەروەها فەرموودەی: (إسمع وأطع)[2] وفەرمودەی (أفلا ننابذهم بالسيف قال: لا ماصلوا)[3]

و هەروەها فەرموودەی عوبادەی کوری سامت کە دەڵێ: (دعانا النبي ﷺ فبايعنا.. على السمع والطاعة في منشطنا ومكرهنا، وعسرنا ويسرنا، وأثرة علينا، وأن لا ننازع الأمر أهله، إلا أن تروا كفراً بواحاً)[4]

---

(١) صحيح مسلم: (٢٠/٦) سنن أبي داود: (٤٩٦/٢).
(٢) صحيح البخاري: (٢٤٧/١).
(٣) صحيح مسلم: (٢٤/٦).
(٤) صحيح البخاري: (٥٩/٩).

پاش ریزکردنی ئەم فەرموودانە کە فەرمان بە ئارامگرتن دەکەن لە سەر ستەمی دە سەلاتداران وتی: هەر کتێبێك لەکتێبەکانی عەقیدە بکەوە و تەماشای بکە بۆ نمونە:(عەقیدەی تەحاوی) بخوێنەوە کتێبی (السنة) بەربەهاری و(أصول السنة) پێشەوا ئەحمەد، دەبینیت کەدەڵێن: باوەڕمان نیە بە یاخیبوون لە دەسەلأتدارانمان و یاخیبوون لە وان لە نەریتی خەواریجەکانە. و ئەو مامۆستایانەی باسکران لەدەسەلأت یاخیبوون, بۆیە ئەوان خەواریجن, و حوکمی خەواریجیان بە سەردا جێبەجێ ئەبی[1].

لەسەر ئەم قسانە بەردەوام بوو، کە ئەمە پوختەکەی بوو.

پێموت: ئایا لە سەر ئەم بابەتە قسەی ترت هەیە؟.

وتی: نەخێر سوپاس بۆ خوا.

وتم: دەست پێ دەکەین.

پێموت: من لە سەرەتاوە قسەم پێنەبڕیت، لەگەڵ ئەوەی قسەکانت لەدەرەوەی بابەتی گفتوگۆی ئێمە بوو, بەلأم ئەدەبی گفتوگۆ کردن وایە کە من دەرفەتی قسەکردن لەناوەڕۆکی بابەت و دەرەوەی بابەت بۆ تۆ بڕەخسێنم.

پێی وتم: من بۆتی دەسەلمێنم کە یاخیبوون لەدەسەلأتداری موسوڵمان دروست نیە.

---

(١) ئەمە ڕای ئەوانە سەبارەت بە مامۆستایانەی کە لە گەڵ ئەوان هاویەشن لە بیری سەلەفدا، دەبێ بە کەسانی تر تانە و تەشەرێك لێبدەن.

پێموت: باسی من لەگەڵت سەبارەت بە یاخیبوون یا نەبوون نیە، من گفتوگۆت لەگەڵ ناکەم دەربارەی درووست بوون یا درووست نەبوونی یاخی بوون لە دەسەلاتداری موسولمان, و گفتوگۆت سەبارەت بەموحەممەد حوسنی موبارەك لەگەڵ ناکەم, ئەو دەڵێ دەسەلاتدارێکی موسولمانمان هەبوو ناوی موحەممەد حوسنی موبارەك بوو و خەڵکیش لێی یاخیبوون ئەوەش لێ یاخی بێ کەسێکی یاخیبووە، هەر کەسیش داوای کردبێ یا بانگەشەی بۆ کردبێ ئەویش یاخیبووە (خارجي) دەی دیارە ئەو زانا و مامۆستایانەی ناو هێنران خەڵکیان لە سەر ئەم یاخیبوونە هاندلوە بۆ یە ئەوانیش یاخیبوون (خارجون) هەر چەندە بەشمشێر یا بە وشە یاخی نەبوون، ئەوان پێیان دەوترێ ـ بەقسەی ئەو ـ (خەواریجی قەعدییە) کەخراپترین جۆری خەواریجن.

پێموت: قسەی من لەگەڵت ئەم بابەتە نیە.

پێ وتم: دە ی قسەت کامەیە؟.

پێموت: قسەی من لەگەڵت تەوەری باسەکەیە، جۆری جیاوازیەکە لێرەیە، من و تۆ ـ بۆنمونە ـ باوەڕمان بەیاخیبوون لە دەسەلاتداری موسوڵمان نیە جا ئەوەی لەگەڵ ئێمە جیاوازە: ئایا پێی دەڵێین: ئەو هەڵەی کردووە و بەهانەی هەیە؟ یا ئیجتهادی کردووە, ئەگەر پێکابێتی دوو پاداشتی هەیە و گەر هەڵەی کردبێ یەك پاداشتی هەیە؟.

یا دەڵێین: ئەو کەسێکی سەرلێشواو بیدعە چیە، ئەوە تەوەری باسی من و تۆ یە. تا زۆر لەدەرەوەی ئەم تەوەرە قسە نەکەین.

وتی: بەڵێ ئەمە تەوەری باسەکەمانە.

وتم: زۆر جوانە تۆ سەبارەت بەو کەسەی لە دەسەڵاتداری موسوڵمان یاخی دەبێ چی دەڵێی؟.

من سەبارەت بە موبارەك کە شەرعی خوای گۆڕیوە و یاسای دەستکردی هێناوە قسەت لەگەڵ ناکەم، وحوکمی ئەو کەسەی یاسای دەستکردی هێناوە و مەیخواردنی ڕێپێداوە، ئەمە مەسەلەیەکە گفتگۆت لەگەڵ ناکەم, ئەوە باسێکی ترە. نەخێر من سەلماندم بۆت کەموبارەك دەسەڵاتدارێکی موسلمانە ! !.

وتی: کەواتە لێرەدا نەتەوەی ئیسلام کۆکن کە درووست نیە لە دەسەڵاتدار یاخی بێ، دواجار ئەوەی ئەم کۆدەنگیە کەرت و پەرت بکا کەسێکی گومڕاو گومڕاکەرە.

پێموت: ئیجماع چیە؟

وتی: ئیجماع ئەوەیە کەزانایانی موجتەهیدی ئومەت لە یەك لە سەردەمەکان لە سەر کارێکی شەرعی کۆببنەوە.

پێموت: زۆر جوانە، ـ بۆ نمونە ـ گەر پێشەوا ئینول مونزیر وتی: زانایان کۆکن لە سەر فلانە شت ,ئەمە حوکمێکی شەرعیە , غەیری ئەو دێ و دڵێ: حەسەنی بەسری و

موحەممەدی کوڕی سیرین ڕایان جیاوازە, ئەم کۆدەنگیە ناوی چی لێدەنێت؟.

وتی: ئەم کۆدەنگیە هەڵدەوشێنیتەوە.

زۆر جوانە پێموت: تۆ ئێستە دەڵێی: کۆدەنگەن.

وتی: بەڵی نەوەوی وئیبنو تەیمیە ئیجماعیان گواستۆەتەوە, و غەیری ئەوانیش ئیجماعیان گواستۆەتەوە لەسەر حەرامبوونی یاخیبوون لە دەسەلاتداری موسوڵمان .

پێموت: زۆر جوانە منیش لەگەڵتم,وا دەلێم: یاخیبوون لە دەسەلاتداری موسولمان دروست نیە.

بەلام ئەوەی لەگەڵ ئێمە جیاواز بێ گومڕاو بیدعەچیە؟.

وتی: بەڵێ گومڕاو و بیدعە چیە؟!!.

وتی: باشە دەی سەبارەت بە حوسەین (خوای لێ رازی بێ) چی دەڵێیت؟.

وتی: سەرداری گەنجانی ئەهلی بەهەشتە, بە شایەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ).

پێموت: زۆر جوانە، حوسەین (خوای لێ رازی بێ) پێی وایە کە دەسەلاتداری موسوڵمان ـ هەر چەندە پەیڕەوی لە شەرعی خودا بکات ـ گەر زوڵم و ستەمی کرد بەیعەتی نامێنێ. بۆیە دژی دەسەلاتدار ڕاپەڕی و یاخی بوو و شمشێری هەڵگرت و عەبدوللای کوڕی عەباس ئامۆژگاری کرد و پێی ووت: ئەی ڕەیحانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) یاخی مەبە, بەلام

گوێی بۆ نەگرت. پاشان ڕۆژێك ڕۆشت و بە عەبدوڵلای كوڕی عومەر گەشت، ئەویش پێی وت یاخی مەبە بە لأم بە قسەی نەكرد و وتی: ئەمە نامەكانی خەڵكی عێراقە كە دەڵێت: ستەم پەرەی سەندووە و ئەوانیش داوای منیان كردووە، بێگومان منیش دژی ئەم دەسەلأتدارە ستەمكارە ڕادەپەڕم.

بۆیەلەشكری ئامادەكردو و شمشێری هەڵگرت و دواجار كارەساتی كەربەلای لێكەوتەوە كە پێشەوا حوسەینی تێدا شەهید بوو (خوای لیٚ رازی بیٚ).

حوسەین (خوای لیٚ رازی بیٚ) لە دژی دەسەلأتدار شمشێری هەڵگرت.

ئایا تۆ ئەتوانی بڵێی: حوسەین (خوای لیٚ رازی بیٚ) دژی دەسەلأتداری موسلمانان یاخیبووە, كەواتە كەسێكی گومڕاو بیدعەچیە ؟.

وتی: نەخێر.

پێموت: تەواو؟.

وتی: بەلأم حوسەین (خوای لیٚ رلزی بیٚ) یاخی نەبوو ئەوان كوشتیان ! !.

پێموت: چۆن وایە ؟ حوسەین لە مەككە بوو ئەوانیش لە شام و عێراق بوون. حوسەین بە لە شكرەكەی چوو بۆ عێراق ئەوانیش لەكەربەلا ڕووبەڕووی بوونەوە.

ئەمەش ڕووداوێکی بەناوبانگە و کەس ناتوانێ نکولی لێبکات. ئەوان نەهاتن لە ما لەکەی شەهیدی بکەن.
وتی: گەر گوفتاری هاوەڵێك یان ڕەفتاری پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر بوو ئێمە دەست بەقسەی کێ ئەگرین؟.
پێموت: بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ).
وتی: دەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) فەرموویەتی:(لا تنزعنَّ يداً من طاعة) [1] و (جلد ظهرك وأخذ مالك) [2].
کەواتە ئەوە قسەی هاوەڵێکە.
پێموت: منیش لەگەڵتم دەڵێم: درووست نیە دژی دەسەلاتدار یاخی ببی, بەلام گەر یاخیبوو ؟ ئەمە تەوەری باسەکەمانە. ئایا گومڕا و بیدعە چیە؟ یا ئەگەر یاخیبوو ئەو کەسە تەئویلی کردووە، گەر پێکای دوو پاداشتی هەیە، و ئەگەر هەڵەی کرد پاداشتێکی دەست ئەکەوێ.
وتی: من نالێم حوسەین (خوای لێ رازی بێ) گومڕا و بیدعە چیە, بەلام دەڵێم, ئێمە قسەی یەك هاوەڵ وەرناگرین, ئایا تۆ ئەتوانی قسەی هاوەڵێکی تر بهێنی؟.
پێموت: بەڵێ.
وتی: کێ؟.

---

(١) صحيح مسلم: (٦/٢٤).
(٢) لە پێشەوە تەخریج کرا.

پێموت: لەپاش شەهید بوونی حوسەین (خوای لێ رازی بێ) بەپێنج ساڵ هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەر (سولەیمانی کوڕی سورەد) (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئەی خەڵکی عێراق خوێنی حوسەین لە گەردنمانە پاشان لەشکرێکی بە ناوی (تەوابین) ئامادە کرد و خۆی سەرکردایەتی کرد و ژمارەیان چوار هەزار جەنگاوەر بوو, لەدژی دەسەلاتدار یاخی بوو و لەرووبەڕوو بوونەوەی (عين الوردة) ی بەناوبانگ بەیەکگەشتن و هاوەڵە بەڕێزەکەی پێغەمبەر (سولەیمانی کوری سورەد) شەهید بوو و لەگەڵ شەهید بوونی ژمارەیەك لەجەنگاوەرانی, ئەوانی تریش هەڵهاتن, لەوانە کەهەڵهاتن (سەعیدی کوڕی جوبەیر) بوو (خوای لێ رازی بێ) کە زانایەکی تابعی بەناوبانگ بوو.

ئایا دەتوانی بڵێی: سولەیمانی کوڕی سورەد،هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری خودا گومڕا و بیدعە چیە؟

وتی: نەخێر ناوێرم وابڵێم.

پێموت: نمونەی سێیەمت پێدەڵێم.

عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر (خوای لێ رازی بێ) لەدەسەلاتداری سەردەمی خۆی یاخیبوو، کاتێ بینی ستەمکار و زالمە، دەسەلاتی میسری لێ سەندەوە و والی مەکەی دەرکرد و ئیبنو مەخرەمەی هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر لەمەککە پشتیوانی لێکرد، و عبدول مەلیکی کوڕی مەروان حەجاجی

کوڕی یوسفی سەقەفی ڕەوانەکرد بۆ جەنگی عەبدوللآی کوڕی زوبەیر لە مەکە.

لەشکری عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر لەناو مەکەدابوو, حەجاجیش بە مەنجەنیق ئاگربارانی کەعبەی کرد و عەبدوڵلای کوڕی زوبەیریش شەهید بوو، پێش شەهید بوونی عەبدوڵلا ئیبنو مەخرەمە هاوەڵی پێغەمبەری لەگەڵ بوو پارچەیەك یا بەردێك بەر سەری کەوت و سێ ڕۆژ نەخۆشی خست و پاشان شەهید بوو و ئیبنول زوبەیر شۆردی.

کەواتە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر ( ئیبنو مەخرەمە) و هاوەلی بەریز ( عەبدوللآی کوڕی زوبەیر ) و هاوەڵی بەڕێز (حوسەینی کوڕی عەلی، و هاوڵی بەڕێز (سولەیمانی کوری سورەد) (خوایان لێ ڕازی بێ) ئەمانە چوارن.

پێنجەم: هاوەڵی بەرێز (عەبدوللآی کوڕی موتیع) خەڵکی مەدینە ڕاپەڕین و ئەمیری مەدینەیان لادا, و دەسەڵآتیان ڕادەستی ئیبنو موتیع کرد، کاتێ کە بینیان کە ئەمیرەکە ستەمی کردو و زولمێ بەر فراوان بوو, دواجار ڕووداوی بەناو بانگی (الحرة) ڕوویدا.

ئەمانە پێنج هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر بوون (درودی خوای لێ بێ) بەشمشێر یاخیبوون نەك بە وشە.

ئایا ئەتوانی بڵێی ئەمانە گومڕاو بیدعە چین؟.

وتی: نەخێر.

پێمـوت: کەواتــە بابەتەکــە ڕای جیـاوازی تێدایــە, تــۆ بانگەشــەی ئیجمــاع لەســەر مەســەلەیەك دەکــەی، کاتێــك مەسـەلەیەك بانگەشـەی ئیجمـاعی لەسـەر کـراوە کەسێك یـان دووان جیـاواز بـوون ئیجماعەکـە هەڵدەوەشـێتەوە، کەواتـە ئیجماعەکە بەکردەوەی پێنج هاوەڵانی پێغەمبەر(درودی خـوای لەسەربێ) هەڵوەشاوەتەوە.

وتی: من لەگەڵتم, بەڵام پاش سەردەمی هاوەڵان ئیجماع دامـەزراوە کـەیاخیبوون لەسـەڵاتدار درووسـت نیـە، بـازوڵم و ستەمیش بکات!!.

پێمـوت: گــەر نمونەیــەك لەقســەی تــابعی بهێــنم؟.

وتی: بەڵێ, ئایا تابعیەك هەیە کە لەدەسەڵاتدار یاخیبوو بێ؟.

پێمـوت: لــە گــەڵم وەرە بـرای بــەڕێز، هــاوەڵ کێیــە؟.

وتی : ئـەو کەسـەیە کـە پێغەمبـەری دی بـێ و بـە موسـوڵمانی کۆچی دوایی کرد بێ .

پێموت: تابعی کێیە؟.

وتـی: ئـەو کەسـەیە کـە هـاوەڵی پێغەمبـەری دی بـێ و موسوڵمان بێ و کۆچی دوایی کرد بێ.

پـێم ووت: کەواتـە (سـولەیمانی کـوری سـورە د) هـاوەڵی بـەڕێز و چـوار هـەزار جەنگاوەرەکـەی کـە لەگـەڵی بـوون ئـەو سەرکردایەتی دەکردن ناوی چییان لێ دەنێیـت ؟ نـاوی تـابعی یـان لێـدەنێیت، گشـتیان تـابعین, چـونکە (سـولەیمانی کـوری

سورەد) یان دیوە کە هاوەڵی پێغەمبەرە ئەوە چوار هەزار لەتابعی. و لە شکری عبدوللای کوڕی زوبەیر لەتابعین و هەروەها لەشکری حوسەین (تابعین)ن، هەموو ئەوانەی لە (تابعین)ن و تۆش دەڵێی: هیچ تابعی یەك ئەمەی نەوتوە !.

وتی: لە پاش سەردەمی هاوەڵان و (تابعی) یەکان ئیجماع دامەزراوە لەسەر درووست نەبوونی یاخیبوون!!!. دەبێ سنگت گوشاد و فراوان بێ.

وتی: دەتوانی لەپاش سەدەی دووەم ڕای جیاواز باس بکەی؟ چونکە نەوەوی و ئیبنوحەجەر ئیجماعیان گواستۆتەوە لەسەر یاخینەبوون لەدەسەلاتدار.

پێموت: من پێموتی گەر زانایەك ئیجماعی گواستەوە و کەسێکی ترمات و جیاوازی چەسپاند و تویانە: ئەوەی شتێکی زێدەی زانی بەڵگەیە لەسەر ئەو کەسەی نەیزانی.

کەواتە ئیجماعەکە هەڵدەوەشێتەوە، ئەوەش پێنج هاوەڵ و چوار هەزار لە تابعین؟ ئایا بە مانای ئیجماع هەڵناوەشێتەوە؟؟.

ووتی: ئەی دەبێ ئەو زانایانە بۆ ئیجماعیان گواستۆتەوە؟.

پێموت: لەبەر دوو هۆ: یەکەم: یان ئاگاداری ئەم جیاوازیە نەبوون، ئەمەش کارێکی دوورە.

دووەم: ئەوانەی ئیجماعیان گواستۆتەوە لەسەر درووست نەبوونی یاخیبوون لە دەسەلاّتدارێك کەپەیڕوەی لە شەرعی خوا دەکات و کەسێکی دادگەرە، و ئەوانەش دژی دەسەلاّتدارێکی ستەمکار یا دژی کەسێك ئایینی خوای گۆڕیوە یاخی بوون و ئاگاداری ئەم جیاوازیەش بوون.

پێموت: ئەم جیاوازیە دوای سەدەی دووم چەسپاوە.

سەحیحی بوخاری فەرموودەی ژمارە (٧٠٥٦) بێنە و تەماشایکە دەبینی حافیز ئیبنو حەجەر: جیاوازی زانایانی گواستۆتەوە، حافیز ئیبنو حەجەر لە سەدەی چەند ژیاوە؟.

لەسەدەی نۆی کۆچی.

ئیبنو حەجەر لەساڵی (٨٥٢ ك) کۆچی دوایی کردوە. ئەمەش دەقی قسەی ئیبنو حەجەرە و بۆتانی دەخوێنمەوە تا بزانن ئەم بابەتە جیاوازی تێدایە.

ئیبنو حەجەر لە پەڕوای (فتح الباری) لە ژێر فەرموودەی (٧٠٥٦) دەڵێ:

(ونقل ابن التين عن الداودي قال: الذي عليه العلماء في أمراء الجور، أنه إن قدر على خلعه بغير فتنة ولا ظلم وجب، وإلا فالواجب الصبر)[1]

واتە: ئیبنو ل تین لە داوودی ئەگوازرێتەوە کە دەڵێ: ڕای زانایان سەبارەت بەدەسەلاّتدارانی ستەمکار ئەوەیە: گەر توانرا

(١) فتح الباري لابن حجر: (٨/١٣).

به بێ ئاشوب و ستەم، لە پۆستەکەی دوور بخرێتەوە ئەوە واجبە ئەم کارە بکرێت، ئەگینا دان بەخۆداگرتن پێویستە.

پێموت: ئێستە تەماشاکە کە ئیبنو حەجەر لە ئیبنو تین و داودی دەی گوازرێتەوە و خۆشی دانی پێدا دەنێ، سێ زانا دەیسەلمێنن کە خیلافی تێدایە.

خەڵکی دەڵێن: یاخی بوون لەدەسەلاتدار ـ گەر زوڵم و ستەم بکات ـ دروستە،تۆش دەڵێی ئیجماعی ئومەتی لەسەرە کە یاخیبوون درووست نیە و کەس خیلافی لەمەدا نیە ! !. واتە مەسەلەکە پەیوەستە بە هاوسەنگی بەرژەوەندی و زەرەر و زیان، جا ئەگەر لەم یاخیبونەدا زیانی تێدابوو با دان بەخۆیدا بگرێت.

ئیبنو حەجەر پاشان لێدوان دەدات و دەڵێ:

(وعن بعضهم لا يجوز عقد الولاية لفاسق ابتداء)[1]

واتە: هەندێك وتویانە: هەر لەسەرەتاوە درووست نیە بەیعەت بەکەسی فاسق بدرێ.

واتە: گەر حوسنی موبارەك ئەو ڕۆژەی دەسەلاتی گرتە دەست فاسق بوو بێ لەسەر ئەم ڕایە بەیعەتەکەی دانەمەزراوە، بەیعەتی لەگەردەنی هیچ کەسدا نیە، ئەمە وتەی ئیبنو حەجەرە.

---

(١) فتح الباري لابن حجر: (٨/١٣).

درێژەی بەقسەی ئەو دەدەین: (فإن أحدث جوراً بعد أن كان عدلا، فاختلفوا في جواز الخروج عليه والصحيح المنع إلا أن يكفر فيجب الخروج عليه)[1]

واتە: ئەگەر دەسەڵاتدار پاش ئەوەی دادگەر بوو ستەمی لێ پەیدابوو، واتە مرۆڤێك دەسەڵاتی گرتە دەست و دادگەر بوو پەیڕوەی لەشەرعی خوا دەكرد، پاش یەك دوو ساڵ زوڵم و ستەمی كرد جا ئەگەر زوڵم و ستەمی لێپەیدا بوو پاش ئەوەی كە دادگەر بوو، زانایان جیاوازن لەدرووست بوونی یاخیبوون لەم دەسەلاتدارە.

پێموت: دوو خەت لەژێر وشەی (فاختلفوا في جواز الخروج عليه) دانێ.

دەڵێ: (و الصحيح المنع إلا أن يكفر فيجب الخروج عليه)[2] ڕاستەكەی ئەوەیە كە نابێ لێی یاخیبین مەگەر لە ئایین دەرچێ ئەو كات یاخیبوون لێی واجبە.

ڕێگر نابم لەوەی بڵێم: ڕاستیەكەی ئەوەیە درووست نیە، بەڵام جیاوازن، واتە مەسەلەكە خیلافی تێدایە ،و خیلافەكەش چەسپاوە جا چۆن بانگەشەی ئیجماع دەكەی، پاشان لەسەری بینا دەكەی: كە هەر كەسێ لەم مەسەلەدا جیاواز بێ ئەوە

(١) فتح الباري لابن حجر: (٨/١٣).
(٢) فتح الباري لابن حجر: (٨/١٣).

گومڕاو بیدعە چیە؟ تەنانەت گەر فلاَن فلاَن مامۆستاش بێت.. تا دوایی.

وتی: تا ئێستا قەناعەتم بە وتەکانت کرد لەم تەوەرەدا، بەلاَم من سەرم سوڕماوە بۆ چی زانایان ئیجماعیان گواستۆتەوە لە سەر درووست نەبوونی یاخیبوون لەدەسەلاَدار، و ئەم فەرموودانەش لەبەردە ستیان بووە.

پێموت: برای بەڕێزم ئیجماع لێرەدا لە سەر حوکمێکی شەرعیە؟.

وتی: بەڵێ.

پێموت: حوکمەکە لێرەدا عیلەتی هەیە یا نیەتی؟.

وتی: نازانم.

پێموت:حوکمی شەرعی یا (تعبدی)یە یاعیلەتی هەیە ,واتەعیلەتەکەی دیارو روونە.

وتی: چۆن؟.

پێموت: نوێژی شێوان سێ ڕکاتە، ئەم حوکمە(تعبدی) یە یا عیلەتدارە خەڵکینە؟.

(تعبدی)یە گەر کەسێ پرسیاری لێ کردین: بۆ چی نوێژی شێوان سێ ڕکاتە: پێی دەلێم: چونکە(تعبدی)یە , بەم جۆرە خودا دایناوە، بەلاَم مەی حەرامە,چەند ئایەتێك دەربارەی حەرام بوونی دابەزیوە, کەواتە حوکمەکەی (تعبدی) یە یا عیلەتدار؟. عیلەتدارە، زانراوە بۆ چی حەرامکراوە ؟ چونکە:

(سەرخۆشـــکەرە) بۆیـــەحوکم لەگـــەڵ عیلەتەکـــەی دەســـوڕی لەکاتی بوون ونەبوندا، جا ئەگـەر مرۆڤێـك لـە بیابانـدابوو و لـە تینوان تیا ئەچوو, دڵنیـابووین لـەمردنی, لـە بەردەسـتی مـەی هەبوو , لەو کاتەدا زانایـان دەڵـێن: دوو زیـان لەبـەردەم مانـە: زیانی یەکەم: سەرخۆش بوون بە مەی کەحرامە. زیانی دووەم: مردن و تیاچوون.

جا ئێمە زیانی گەورە (مردن) بە ئەنجامدانی زیـانی سـوك دوور دەخەینـــەوە و بـــا مەیەکەبخواتـــەوە بـــۆ هەنـــدێ کـــات سەرخۆش ببێ بۆ ئەوەی بژی تـا بـەخواردن وخواردنـەوە پێـی دەگەین.

جـــا ئەگـــەر حـــوکم عیلـــەتی هەبێ,حوکمەکـــە لەگـــەڵ عیلەتەکەی دەگەرێ لەبوون و نەبووندا, بەڵام ئەگـەر (تعبـدی) بوو پێویستەلەسەری ڕاوەستین.

پاشان لێم پرسی: حەرامبوونی یاخیبوون لەدەسـەڵاتداری موسوڵمان حوکمێکی (تعبدی)یە؟.

وتی: نەخێر.

پێموت: عیلەتدارە.

وتی: بەڵی بە بەڵگەی ئەوەی کە گشت ئەوانەی کەدەڵێن: یـاخیبوون حەرامـە لەدەسـەڵاتدار دەڵـێن: حەرامـە یـاخیبون لەدەسەڵاتدار لەبەرئەوەی زەرەر و زیانی مەزنی تێدایە.

یەکێکی تر دەڵێ: لەبەر ئەوەی خوێن ڕێژی و زاڵبونی دوژمنانی لە سەر موسڵمانانی تێدایە.. تا دوایی. جا ئەوانەی باسی ئیجماعیان کردووە, ئیجماعیان گواستوەتەوە لەسەر حەرام بوونی یاخیبوون لەدەسەلأتداری موسوڵمان، واتە لەکاتی بوونی زەرەر و زیان، بەلأم گەر دەسەلأتداری موسوڵمان دەسەلأتدارێکی زاڵم و ملهور بوو بەشێك لە ئاینی دەگۆڕی و تاوانبار بوو بە چەندین گوناە و تاوان وخەڵکیش توانیان لای بەرن و کەسێکی تر دانێن بەزیانێکی کەمتر لەزیانی بوونی ئەم دەسەلأتدارە، بەمەش دژی ئەو ئیجماعە نابینەوە کەزانایان گواستویانەتەوە.

من پێم خۆش بوو پرسی ئیجماعی تێبگەیەنم.

وتی: واتە ئەم بابەتە عیلەتدارە.

پێموت: بەڵێ، من و تۆ دەڵێین: نابێ یاخی بین لەدەسەلأتداری موسوڵمان, هەرچەندە زوڵم و ستەم بکات, بەلأم ئەوانەی ڕایان جیاوازە لەگەڵمان دەڵێن: نەخێر یاخیبوون واجبە، لەبەر زەرەر و زیانی زۆر و گەورەی بوونی ئەو دەسەلأتدارە.

تۆ دەڵێی: تەماشای شۆڕشی میسر کە زیاتر لە (٨٥٠) یا (٧٥٠) کەس کوژرا تا موبارەك لادرا لەدەسەلأت، من دەبمە دادوەر لەنێوانتان ئەوانە لە گەڵت جیاوازن و دەڵێن: ئەم زیانە

کوشتنی (٧٥٠) موسوڵمان سوکترە لەزیانی مانەوەی موبارەك لەدەسەلآت،پێمان وتن: لە بەرچی؟.

وتیـان: نـەك (٧٥٠) کـەس، موبـارەك هـەزاران کەسـی لەبەندیخانـە گۆشـت و شـاردنیەوە و هـەزارەهای خسـتە بەندیخانـەوە, بەڵگـەی ئەمـەش کاتێـك بارەگاکـانی ئاسایشـی دەوڵەت سوتێنرا و زەویەکەیان هەڵکەنـد لـەژێر زەوی ئێسك و پروسکی زۆرێك لەخەڵکی کە کوژرابوون لەژێرخاك نرابوون .

کەواتە ئەوان پێیان وایە زیانی شۆڕشەکە کەمترە لە زیانی بوونی دزینی سامانی خـەڵکی و کوشـتن یـان و سەرشـۆڕکردنی موسوڵمان بۆ دووژمنانی ئیسـلام و غـەیری ئەمانـە، و تـۆ پێـت وایە زیـانی شـۆڕش گـەورەترە لەمانـەوەی موبارەك، بمایـەوە باشتربوو.

من ڕێز بۆ ڕای تۆ و ڕای ئەوانیش دادەنێم، بەلآم ئەوان بـە تۆ ناڵێن: گومڕاو و بیدعەچی.

بە هەمان شێوە تۆش نابێ بڵێی بەوان: گومڕا و بیدعەچی ـ تەواو ـ ئێوە جیاوازن لەچەند مەسەلەیەك, هـەر یـەك دەسـت بـەوە دەگرێـت کـە دەیـەوێت، بـەلآم بڕیـاری گـومڕا بـوون و بیدعەچی بوون مەدە.

وتـی: بـەم ڕێگەیـە لـە ئیجمـاع تێگەیشـتم، بـەلآم هێشـتا گومانێکی سادەم ماوە !.

پێموت: بیهێنە.

وتی: چۆن تۆ بە کردەوەی حوسەین و عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر و سولەیمانی کوڕی سورەد و عەبدڵلای کوڕی موتیع و ئیبن و مەخرەمە (خوایان لێ ڕازی بێ) بڕیار بەسەر مندا دە دەی و فەرموودەی پێغەمبەر زۆر ڕوونە کەدەفەرمووێ: (الا أن تروا كفراً بواحاً)[1] ئایا حوسنی موبارەك لە ئایین دەرچووە بە کوفرێکی ئاشکرا تا یاخیبوون لەدژی دروست بێ؟ ئەمە دەقی شەرعیە، تۆ دەزانی گەر لە فەرمودەکەدا بهاتایە:

(الا أن تروا معصية بواحاً أو الا أن تروا إثماً بواحاً) واتە: مەگەر تاوانێك و گوناهێکی ئاشکرا ببینن.

ئەو کات دەمانوت: قەیناکات، بەڵام لە کاتێکدا فەرموویەتی:(كفراً بواحاً) وشەی: (بواحاً) واتە: هیچ تەئویلێك قبوڵ نەکات، بۆ نمونە: گەر من و تۆ جیاواز بووین لە کافربوونی موبارەك کە واتە تەئویلی قبوڵ کرد و دروست نیە لێی یاخی بین، پێویستە کوفرێکی ڕاشکاو بێ هەر کەس بینی پێی بڵێ: کافرە یا ئایینی خۆی بگۆڕێ ببێ بە مەسیحی یا جولەکە و هاوشێوەی ئەوان، ئەو کاتە ڕاشکاوە. پێموت: وەرە برا بەڕێزەکەم من دوو شتت بۆ ڕوون ئەکەمەوە هەر چی گرفتت هەیە لای دەبات.

وتی: ئەو دوو شتە چیە؟.

---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

پێمـوت: یەکـەم: وەرە گشت ڕیوایەتی فەرمودەکە کۆکەینەوە، حافیزی ئیبنو حەجەر ڕیوایەتی حەدیسی یەکەمی کۆ کردۆتەوە ببینە.

وتی: بەڵێ.

بەوەی کەوتمان کت و پڕ سەرسامی گرتی، بۆ ئەو شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو بەڵام ئەو پیاوە کەسێکی زۆر بە ویژدان بوو، بەفەزڵی خوا مەبەستەم لە گفتوگۆ و دیالۆکدا.

پێموت: ئەم فەرموودەی قسەی لێ دەکەین، فەرموودەی عوبادەی کوڕی سامیتە کەتێدا دەڵێ:

(بايعنا رسول الله (ﷺ) على السمع والطاعة.......)[1]

حافیز ئیبنو حەجەر دەڵێ: ( الا أن تروا كفراً بواحاً) لەو فەرموودەی باسمان کرد ژمارە (٧٠٥٦)

حافیز دەڵێ: لەڕیوایەتی ئیبنو حیبان هاتووە:( إلا أن تكون معصية لله بواحا)[2] و لە ڕیوایەتی پێشەوا ئەحمەد لەڕێگەی عومەری کوڕی هانئ لەجەنادەوە هاتووە: (ما لم يأمروك بإثم بواحا)[3] ولە ڕیوایەتی ئیسماعیلی کوڕی عوبەید لای ئەحمەد و تەبەرانی و حاکم لەڕیوایەتی ئەو لەباوکیەوە لەعوبادەوە فەرمووی: (سيلي

---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

(٢) صحيح ابن حبان: (١٠/٤٢٨).

(٣) مسند أحمد: (٥/٣٢١).

أموركم بعدي رجال يعرفونكم ما تنكرون، و ينكرون عليكم ما تعرفون، فلا طاعة لمن عصى)[1] كەواتە گوێڕایەڵی کەس ناکرێت بێ فەرمانی خودا بکات.

کەواتە: (کفراً بواحاً) لەڕیوایەتیکدا و (معصیة بواحاً) لەڕیوایەتێکی تر و (اثماً بواحاً) لەڕیوایەتیکی تر، بەلاَم ئەمەی کە دەڵێ: چۆن بەگوفتاری هاوەڵان و تابیعیەکان ڕووبەڕووی فەرموودە دەبیت.

من لێت دەپرسم، ئەمەش خاڵی دووەمە: گەر ئەم ساتە لێی تێبگەیت یەکسەر ئاسودە دەبی

وتی: چیە؟.

وتم: گەر تۆ و کەسێکی تر لە تێگەیشتنی مەسەلەیەك، لە ئایەتێك یا فەرموودەیەك جیاواز بوون. هەر دوو کیشتان لەسەر پرۆگرامی سەلەفی صاڵح بوون بە تێگەیشتنی کێ لێی تێبگەین؟.

وتی: بەتێگەیشتنی سەلەفی ساڵح.

پێموت: زۆر جوانە سەلەفی ساڵح کێیە؟.

وتی: هاوەڵان و تابعیەکان و ئەوەی لەسەر ڕێبازی ئەوانە.

وتم: سوپاس بۆ خوا گرفتێکمان لایە لەسەردەمی سەلەفی ساڵح ڕوویداوە، سوپاس بۆ خوا خەڵکی لەدژی دەسەلاَتدار

---

(١) مسند أحمد: (٣٢٥/٥) المعجم الأوسط (١٩٠/٣) المستدرك على الصحيحين للحاكم:(٤٠٢/٣).

یـاخیبوون و شمشـێریان هـەڵگرتوە، ئایـا پێیـان بڵـێن ئەوانەئیجتیهادیان کردووە؟.

یا بڵێن گومڕا و بیدعە چین؟.

ئایا حـوکمی سـەلەف لەسـەر ئـەو هاوەڵانـەی یـاخیبوون بڕیاری گومڕا بوونیان داوە ؟.

وتی: نەخێر.

تەماشای ژیاننامەیان بکە لەپەڕاوی (سير أعلام النبلاء) زەهەبی دەڵێ: سولەیمانی کوڕی سورەد یاخی بـوو و شـەهید کرا، خۆزگە یاخی نەبوایە، و فلانە کەس یـاخیبوو وئیجتیهـادی کرد، خۆزگایە یاخی نە بوایە.

واتـە: تێگەشـتنی سـەلەف وایـە کـە کـەس دژ بـە دەسـەڵاتداری موسـوڵمان یـاخیبوو ئیجتیهـادی کـردووە، جـا ئەگەر پێکابێتی دوو پاداشتی هەیـە، و ئەگـەر هەڵـەی کـرد بـێ پاداشـتێکی هەیـە، بـەڵام تـۆ واتێگەشـتووی کـە ئـەو گـومڕا و بیدعە چیە!!.

وتم: بەتێگەشتنی کێ تێبگەین ؟.

وتی: بەتێگەیشتنی سەلەفی ساڵح.

وتم: ئایا بینیت؟.

وتی: بەڵێ سوپاس بۆ خوا بەم جۆرە تەواوە.

وتم: ئایا ڕازیت؟.

وتی سوباس بۆ خوا.

وتم: خاڵەکانی تر دواتر ئەچینە ناوی.

وتی: باشە.

بە هەر حاڵ: لەڕۆژی دواتر لە مەوعیدێکی تر هاتینەوە، ئەو برادەرە ئەم بابەتەی سەلماند.

پێش ئەوەی دەرچین لەم بابەتە ئەم برایەمان پیاوێکی بەویژدان بوو، تۆ ئەزانیت کاتێك گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکی کەم زانست دە کەی زۆر ماندوو دەبی لەگەڵی، بەلاّم کاتێك گفتوگۆ لەگەڵ پیاوێکی شارەزا لەزانست دە کەی زۆر زۆر ئاسودە دەبی.

وتی: تەواوە من ئێستە قەناعەتم کرد بەوەی کە بابەتی یاخیبوون لەدەسەلاتداران: دروست نیسە یاخی بی لەدەسەلاتداری موسولمان، ئەوەش لێی یاخی دەبێ کەسێکی مەعزورە یان تەئویلی کردووە، ناڵێن کە سێکی گومڕا و بیدعە چی.

پێموت: زۆر جوانە، کە واتە ئێستە دەربارەی ئەو مامۆستا و زانایانە چی دەڵێیت.

وتی: گومڕاو بیدعە چین! !.

پێموت: لە بەر چی برای بەرێزم؟.

وتی لە بەر ئەو بابەتانەی کەماوە.

وتم: بابەتی دووەم بێنە .

## بابەتی دووەم
## دیموکراسی

وتی: دیموکراسی.

پێموت: باشە.

وتی: من لە کتێبی خۆیان بۆت دێنم کتێبی مامۆستا فلان و مامۆستا فلان، و کاسێتەکانیان کە دەڵێت: دیموکراسی کوفرە، دیموکراسی شیرکە, حوکمی خۆبەخۆیە دیارە حوکمیش بۆ خوای بالاّ دەستە، دیموکراسی حوکمی زۆرینەیە، لە دیموکراسیدا گەر ڕاپرسی بکرێت لەسەر قەدەغە کردنی مەی لە میسردا ئێوە ڕاتان چیە قەدەغەی بکەین یا ڕێی پیٚ بدەین؟.

جا لە ٥٥٪ یا ٦٠٪ وتیان نەخێر حەلاڵی دەکەین، و لە ٤٠٪ وتیان نەخێر حەرامە، کەواتە بە حوکمی دیموکراسی مەی حەلاڵە و ئیسلامیش ئەمەی قبول نیە, کاروباری ئاینی ڕاپرسی لەسەر ناکرێت.

وتی: هەموو ئەم قسانەپێش شۆڕش بوو، بەلاّم دوای شۆرشەکە ڕێیان بەخۆیاندا بچنە ناو دیموکراسی و حیزبەکانەوە.

پێموت: جوانە، ئەم مامۆستا بەرز و بەرێزانە کە فەتوای خۆیان گۆڕی یەکێك لەم سیٚ شتە هۆکار بوو. من لە گەڵتم کە ئەوان پێش شۆرشەکە چوونە ناو دیموکراسیان

پێ دروست نەبوو[1]، ئێستەش ڕێیان داوە بەحیزب و ئەندامەکانی بچنەناویەوە، من لەگەڵتم و ئەمەت بۆ ئەسەلمێنم, بەڵام ئێمە تەماشاکەین بۆ فتوای خۆیان گۆڕی، ئەوان لەنێوان سێ ئەگەردان:

١ـ یا ئەو مامۆستایانە فتوای خۆیان گۆڕیوە لە بەرامبەر وەگرتنی بەرتیلێك یان بڕێك پارە یا وەرگرتنی پۆستێك؟.

٢ـ یا فتوای خۆیان گۆڕیوە لە بەر ئەوەی ئیجتیهادیان گۆڕاوە, وەك شتێکی سروشتی لەهەر ساتێکدا, پێشەوا شافیعی پێشتر بۆچونێکی کۆنی هەبوو کە هاتە میسر مەزهەبێکی نوێی دانا,پێشەوا ئەحمەد لەهەندێك بابەت دوو ڕیوایەتی هەیە، ئیجتیهادیان گۆڕاوە و زانستێکی نوێ فێر بوو، پێشتر نەی بوو.

٣ـ یا ئەگەری سێیەمە، بارودۆخەکە گۆڕاوە بەو پێیە ئەوانیش ئیجتیهادیان گۆڕی ئەم سێ ئەگەرە هەیە.

وتی: باشە.

وتم: ئەگەری یەکەم، تۆ چاوەڕوان دەکەی ئەو زانا و مامۆستایانە حیزب پێیان وتبێ: ئێوە بڵێن حیزبایەتی حەڵاڵە و ئێمەش بۆ هەریەك لەئێوە (٤ تا ٥) ملیۆن یا پۆستێکتان پێ ئەدەین؟.

---

(١) دیموکراسی ئامراز و میکانیزمێکە بۆ دەودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات و وەرگرتنی ڕای خەڵکە بۆ دەستنیشانکردنی کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو لە ڕێی هەڵبژاردنەوە دیارە ئەمە ئامرازێکی زۆر باشە و بەدیلی ئەوە لەم سەردەمەدا حوکمی خۆسەپاندن و تاکڕەویی و پشتاوپشتە.

وتی: بێگومان نەخێر ئەو زانایانە لەوە گەورەترن.
وتم: سوپاس بۆخوا، کەواتە دوو ئەگەرەکەی تر ماوە . ئەوەی ماوە ئیجتیهادیان گۆڕیوە ,یا بارودۆخەکە گۆڕاوە ئەوانیش بۆچونی خۆیان گۆڕیەوە و من پێت دەلێم: ئەگەری سێیەم بەهێز ترە بارودۆخەکە گۆڕاوە بۆیە بۆچونی خۆیان گۆڕی .
وتی: چۆن؟.
وتم: بۆ نمونە ئەوان دەیانوت چوونە ناو هەڵبژاردن و دیموکراسی لەسەردەمی موبارەك هیچ بایەخێکی نەبووە، و هیچ بەرژەوەندی تێدانەبووە, چونکە پارتی نیشتیمانی دەسەلآتدار هەڵبژاردنەکانی ساختە دەکرد و حکومەتیش دژایەتی ئەو ئیسلامیانەی دەکرد کە دەچونە پرۆسەی هەڵبژاردنەوە و بەندی دە کردن و بانگەوازی لێی تەسك دەکردنەوە و پارتی نیشتیمانی زۆرینەی کورسیەکانی بۆ خۆی قۆرخ دەکرد و ٢٠٪ یا ٣٠٪ لەسەر پارتەکانی تر دابەش دەکرد.
کەواتە چوونە ناو ئەنجومەنی گەل هیچ شتێکی نەدەگۆڕی جا بۆیە زانایان و مامۆستایان وایان بەچاك دەبینی یا بەرژەوەندی وا دەخوازێ کەلەو کارە دور بکەونەوە، چونکە چەندین زەرە و زیان دووچاری بانگەواز دەبێتەوە، لەبەرامبەر دەستخستنی بەرژەوەندییەکی وە همی پوچ، جا کە دۆخەکە گۆڕا و ئەنجومەنی سەربارزی دەسەلآتی گرتەدەست وتیان: ئێمە هەڵبژاردنێکی ئازاد و خاوێن ساز دەکەین و عەلمانیەکانیش گوتیان: ئیسلامیەکان تەنها لە ٤٪ یا ٥٪

دەهێنن و خەڵك دژی توندو و تیژیە و ئەوە و ئەوەی پێناخۆشە !

جا ئیسلامیەکان چونە هەڵبژاردن - پاش ڕاوێژ لەگەڵ ئەو زاناو مامۆستایانە - ئەوانیش ڕێیان پێدان و وایان بینی کە لەم کاتەدا کە بەرژەوەندیەك هەیە شایەنە بۆ ئیسلام پاش گۆڕینی دۆخەکە و سازدانی هەڵبژاردنێکی خاوێن و لەراستیدا وا بوو هەڵبژاردنەکە ئازاد و خاوێن بوو، ئەوە بوو ئەو دەستەکەوتەیان دەست کەوت لەئەنجومەنی گەل و سەرۆکایەتی و هیتر.

وتی: من لەگەڵتم دۆخەکە گۆڕا, بەلام حوکمی شەرعی بە گۆڕانی دۆخ ناگۆرێت، ئیسلام جێگیرە.

پێموت: نەخێر لەمەدا لەگەڵتنیم.

وتی: چۆن ؟

پێم ووت: حوکمی شەرعی بەگۆڕانی بارودۆخ دەگۆرێت.

ووتی: یەك نمونەم بۆ بهێنە ,من بۆتی دەسەلمێنم.

پێموت: ئەم نموونە وەرگرە, پیاوێك لەحاڵەتی ئاسایی, هەموو شتی لایەخواردن و خواردنەوە, هیچی پێویست نیە, ئایە دورستە گۆشتی مردارۆبوو بخوات؟.

وتی: دروست نیە.

پێموت: گەر لە باری ناچاری بێ لە بیابان و جێگەیەك بێ خۆراکی دەست ناکەوێت و لە برسا لەناو دەچی و بەلام مردارۆبویەکی دەست کەوت، درووستە لە گۆشتی ئەو مردارۆبووە بخوات؟.

وتی: بەڵێ گەر پیاو لەباری ئاسایی بێت درووست نیە لە گۆشتی مردارۆ بوو بخوات بەڵام لەباری ناچاری هەمان پیاو بۆی هەیەلێی بخوات، و ئایاتەکانی قورئان ئەمە دەچەسپێنن.

بەڵێ.پرسیار: بۆچی حوکمی شەرعی گۆڕا لەبۆ یەك کەس؟.

وتی: لەبەر گۆڕانی بارەکەی لە ئاسایی بۆ ناچاری.

پێموت: گەر فەتوا بگۆڕی بە گۆڕانی دۆخی کەسێ, ئەی بەگۆڕانی دۆخی نەتەوەیەکی تەواو؟.

وتی: تەواو بۆتی دەسەلمێنم,بەڵام لێرە مەسەلەیەکی گرنگ هەیە.

پێموت: چیە؟.

وتی: ئەوان پێشتر وتیان دیموکراسی شیرك و کوفرە,ئایا دیموکراسی لەشەو و ڕۆژێکدا گۆڕا بۆ ئیسلام و ئیمان وشورا.

وتم: نەخێر ئەوان تا ئێستەش دەڵێن: دیموکراسی پێچەوانەی ئیسلامە[1]، بەڵام ڕێیان داوە بەو حیزب ولایەنانەی

---

(١) لە گەڵ ڕێز و حورمەتم بۆ ڕای ماموستا وەحید و مامۆستایانی هاوبیری، بەندە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیم، دیموکراسی گەر وەك میکانیزم و وەسیلە تەماشای بکەین ناتوانین بڵێین لەگەڵ ئیسلام ناکۆکە، چوونکە حوکم بەسەر وەسیلە و میکانیزمدا نادرێت بەڵکو بە سەر ئامانج و دەرنجامەکەی دەدرێت، گۆڕانی بۆچوونی ئەو مامۆستایانە سەبارەت بە دیموکراسی بەڵگەیە لە سەر ئەوەی حوکم لە سەر دیموکراسی حوکمێکی زاتی نیە، بەڵکو شوێن ئەو ئامانجە دەکەوێت کە دیموکراسی بۆ بەکار دەهێنرێت.

دەیانەوێ بەشداری بکەن لەبەر ناچاری یا پێویستی و بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی بۆ ئیسلام و موسوڵمانان.

من لێرە نمونەیەکت بۆ دێنمەوە.

وتی: کامەیە؟.

وتم: منداڵی دراوسێکەت لە منداڵی تۆیانداو سەریان شکاند چی دەکەی؟.

سکالایەك تۆمار دەکەی و پێشکەشی بنکەی پۆلیسی دەکەی و ئەویش ڕەوانەی دادگای دەکات وتۆش لەبەردەم داوەر کە بەغەیری قورئان حوکم دەکات ڕادەوەستی و داوای مافی خۆت دەکەی.

نمونەی دووەم: پیاوێك ئۆتۆمبێلێکی لێکرییت و سەد هەزاری لا ما تۆش پسولە و چەکت لێوەرگرت، بەلام قەرزەکەتی دواخست و نەی ویست بداتەوە، سکالات لای دادوەر تۆمارکرد کە بەغەیری قورئان حوکم دەکات, بۆ ئەوەی مافی خۆت وەرگری و ئێمە گوێمان لێت دەبێ لەسەر مینیەرەکان دەڵێی: دروست نیە کێشە بەرینە لای غەیری خودا، سپاردنی کێشە بەیاسا دەستکردەکان پێچەوانەی شەرعی خودایە, بەلام بەناچاری چوویتە دادگاکان.

وتی: بەناچاری چووم.

پێموت: سوێند بەخوا هیچ ناچار نەبووی دەتوانی چاوپۆشی لەسەد هەزارەکە بکەی و دەکرا چاوپۆشی لەمافی منداڵەکەت بکەیت، بەلام تۆ لە بەرژەوەندیەکی تایبەت پەنات بۆ دادگا بردووە, بەلام ئیسلامیەکان کەچوونە حیزبەکانەوە

نەچوون بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکی تایبەت بەخۆیان بەدەست بهێنن، من و تۆ یەك دەنگین لەمەدا، بەڵکو بۆیە چوونە ناویەوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەك ـ بەمەزەنەی خۆیان ـ بۆ ئیسلام دەستەبەر بکەن، جا یا دەستەبەری دەکەن، یا نایکەن.

بۆ پەیڕویکردنی شەرعی خوا و هەڵوە شاندنەوەی ئەو یاسایانەی لەگەڵ شەرعی خوا ناگونجێن، و دەرکردنی ئەو یاسایانەی کە لە گەڵ شەرعی خوا یەك دەگرێتەوە، و هەروەها سەربەرزکردنی ئیسلامە لەلایەك، یا هاوشێوەی ئەوەیە، واتە: بەرژەوەندی ئیسلامی تێدایە نەك بەرژەوەندی خۆیان، جا چۆن بەهانە بۆ خۆت دێنیتەوە لە پەنا بردنە بەر یاسا دەستکردەکان، دەچێتە ژێر دیموکراسی و ژێر حوکم غەیری قورئان بۆ بارێکی تایبەت یا بەرژەوەندیەکی کەسی، بەلام بەهانە بۆ ئەوان ناهێنیتەوە؟!.

من پێت نالێم: چوونە ناو دیموکراسی درووستە، ئەوەی لەم بابەتە لە گەڵ ئێمە جیاواز بێ و بڵێ: درووستە گومڕاو بیدعە چیە؟.

وتی: ئێستە زانیم کە گومڕا و بیدعە چی نیە، بەڵکو ئیجتیهادی کردووە، ئەگەر پێکابێتی دوو پاداشتی هەیە و ئەگەر هەڵەی کردبێ یەك پاداشتی هەیە.

پێموت: بەڵێ، کەواتە ئێستە ئەو مامۆستایانە و قوتابیەکانیان لای تۆ چین؟.

وتی: گومڕا و بیدعە چین؟ پێم ووت: لە بەر چی!!!.

وتی: چونکە بابەتێکی زۆر گرنگ هەیە.

وتم چی یە؟.

# بابەتی سێیەم
# حیزبایەتی

وتی: بابەتی حیزبایەتیە، چونکە بەڵگەی حەرام بوونی لە قورئانی پیرۆزدا ڕوونە،خوای گەورە ئەفەرمووێ: [وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ][1] الروم: ٣١، ٣٢.

لە قورئانـدا خـوای گـەورە باسـی حیزبـەکان دەکـات و سەرکۆنەیان دەکات.

پێموت: خوای گەورە باسی حیزبەکانی لەقورئانـدا کـردوە و مەدح یان دەکات:[ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ] المجادلة: ٢٢.

کەواتە: وشەی حیزب هەندێك جار مەدح دەکری و هەندێك جاریش سەر کۆنە دەکرێت.

---

(١) بڕوانە ڕابەری توێژەرانی قورئان پێشەوا تەبەری چۆن ئەم ئایەتی ڕاڤە دەکات، ئەم برایانەش چۆن بە سەر زۆرێك لە موسوڵمانانی دەسەپێنن!:
وقوله: (من الذين فرقوا دينهم وكانوا شيعا) يقول: ولا تكونوا من المشركين الذين بدلوا دينهم، وخالفوه ففارقوه (وكانوا شيعا) يقول: وكانوا أحزابا فرقا كاليهود والنصارى. وبنحو الذي قلنا في ذلك قال أهل التأويل...وقوله: (كل حزب بما لديهم فرحون) يقول: كل طائفة وفرقة من هؤلاء الذين فارقوا دينهم الحق، فأحدثوا البدع التي أحدثوا (بما لديهم فرحون) يقول: بما هم به متمسكون من المذهب، فرحون مسرورون، يحسبون أن الصواب معهم دون غيرهم. تفسير الطبري (٢٠/ ١٠٠، ١٠١)

وتی: بەلاّم ئەم حیزبانە موسولمّانیان کەرت و پەرت کردوە، موسولمّانان دابەش بوون بۆ چەند پارتێکی جیاواز، کەرت و پەرت بوونیان زۆر دیارە، و خوای گەورەش دەفەرموێ: [ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا ] آل عمران: ١٠٣.

پێموت: قسەیەکی جوانە، حیزبە ئیسلامیەکان لە بەرژەوەندی دیاری کراو درووست بوون، و نەتەوەی ئیسلامیان کەرت و پەرت کردووە.

پێموت: ئایا نەتەوەی ئیسلام پێش ئەم حیزبانە یەك پارچە بووە؟.

وتی: بەڵێ ئیسلامیەکان پێکەوە بوون.

پێموت: (انصار السنة) و (الجمعية الشرعية) و (الاخوان المسلمون) و (التبليغ ) تا ئەوانی تر و غەیری ئەوان هەبوون، ئەوان یەك پارچە نەبوون تا حیزبەکان کەرت و پەرتی کردبن، و خۆیان لە بنەرەتدا کەرت و پەرت بوون.

پاشان من وتەی بەرامبەرەکەت بۆ دەگوازمەوە، لێم تورە مەبە.

وتی: بەڵێ.

پێموت: هەر مامۆستایەك لەوانە دەستەیەك لەقوتابیان متمانەیان پێکردبوو و لەدەوری کۆبوبونەوە و گوێیان بۆ

قسەکانی دەگرت و لە بەر دەستی فێر دەبوون کاتێك بیرو بۆچونی ئێوە، فیکری مامۆستا رەبیع مەدخەلی هات ئەو قوتابیانە کەوتنە گومان لە مامۆستاکانیان، کە بیدعەیان کردبێ و لەڕێ لایاندابێ، بۆ نموونە ئەگەر مامۆستایەك دە هەزار قوتابی هەبوو بێ ئەگەر پەنجا یا سەد قوتابی دەر چوو بن و ئەم فیکرەیان هەڵگرتبێ ئەوانیش دەستیان کردوە بە لاڕێبردنی ئەوانی تر و دروستکردنی گومان بۆ یان بە هۆکاری ئەم فیکرەش ولآت پەرت و پلآو بوو، جا ئەگەر تۆ باسی کەرت و پەرت بوون دەکەی لەبەرامبەر دا ئەوانیش وا دەڵێن واقیعەکەش وا دەڵێ کە ئەم فیکرە ولآتی کەرت و پەرت کردووە ! پاشان من پرسیارێکت لێ دەکەم.

وتی: بەڵێ.

پێموت: بابەتی حیزبایەتی بابەتێکی کۆنە، یا نوێیە؟.

وتی: بابەتێکی نوێ یە.

پێم ووت: زۆر جوانە واتە حیزبەکان لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێ) نەبوون؟.

وتی: بەڵێ، و لە سەر دەمی هاوەلآنیش نەبوون و لەسەر دەمی چوار پێشەواکەش نەبووە؟.

وتی: بەڵێ هێشتا نزیکترە.

پێموت: دەر بارەی حیزبەکان بڕیاری کێ وەردەگرین؟ واتە: وەك مەسەلەی چاندنی گورچیلە یا جگەر یا گواستنەوەی خوێن و هاوشێوەی ئەمانە بابەتی نوێن ناتواین ئایەتێك یا فەرموودەیەك یا وتەی هاوەڵێك تەنانەت وتەی چوار پێشەواكە بهێنین، چونكە لەسەردەمی ئەوان نەبووە، زانایان دە لێن: دەست بەڕای زانایانی هاوچەرخ دەگرین.

پێی وتم: بەڵێ.

پێموت: زانایانی هاوچەرخ یەكدەنگ نین لە سەر حەرام بوونی حیزبەكان، هەروەها یەك ڕانین لەسەر حەلاڵ بوونی حیزبایەتی بەڵكو جیاوازن: هەندێكیان گەر تەماشای بەرژەوەندی و زیانەكان كردبێ و توویانە: چوونە ناو ئەم حیزبانە دروست نیە و گشت حیزبەكان موسولمانان كەرت و پەرت دەكات، بۆیە مەچنە ناویانەوە.

هەندێكیش دەلێن: نەخێر ئەم حیزبانە گەر ئەم بوارە بۆ عەلمانیەكان جێ بهێلن، لە ئەنجامدا ئەوان سواری ملی موسولمانان دەبن، جا بۆیە پێویستە بچنە ناو ئەم حیزبانەوە و جێ پێیەك بۆ ئیسلام بچە سپێنن و ئەوەی لەتوانامانداىە لەشەریعەت جێ بەجێ دەكەین،لەڕێی ئەم ئامرازەی لە بەردەستماندایە.

ئەگەر وانەکەین خیانەتمان لە [illegible] بەهانە بۆ

ئاینەکەی کردووە، کەواتە جیاوازن، [illegible] زانستی

ئەوی تر دەهێنێتەوە.

واتە: بۆ نموونە من بە چاکی نابینم [illegible] و گرنگی

شەرعی کە سەرقاڵی سیاسەت و حیزب [illegible] کەچونکە

بەزانستەکانیان بدەن تا دوایی، بەڵام [illegible] ئیسلامی

ناو حیزبە ئیسلامیەکانەوە مەبەستیان [illegible] بۆ ئەکەین

لەم دەرگا و گۆشەوە، داوای سەرکەوتن [illegible] گومرا

ودەڵێن: خوا تەوفیقتان بدات، هەرگیز [illegible] دەرچین ئەو

بیدعەچین.

پێی وتم: چاکە بابەتێک ماوە ئەگەر [illegible]

بەیەک جاری لەم بابەتە دەرچووین.

پێموت: چیە؟.

وتی: بابەتی هەڵبژاردنە.

## بابەتی چوارەم
## هەڵبژاردن

تۆ دەزانیت کە دانانی دەسەلاتداری موسوڵمان لەڕێگەی ئەهلی حەل و عەقدەوە دەبێ و هەر ڕێگەیەك پێچەوانەی ئەمە بێت ڕێگەیەکی پووچەڵە، کەوا بێ هەڵبژاردن ڕێگەیەکی پووچەڵە و هەر شتێ لە پووچەڵ بنیاد بنرێ پووچەڵە.

پێموت: من لە دوو ڕووە وەڵامت دەدەمەوە:

یەکەم: ڕێگەی هەڵبژاردن، ڕێگەی دانانی دەسەلاتداری موسوڵمان.

دووەم: بابەتی هەڵبژاردنەکان.

وتی: فەرموو.

پێموت: تۆ دەڵێی دەسەلاتداری موسوڵمان دانانرێت مەگەر لەڕێگەی ئەهلی حەل و عەقدەوە نەبێ. وتی: بەڵێ.

پێموت: ئەمە تەنها ڕێگە نیە بۆ دانانی دەسەلاتداری موسوڵمان، وەك: ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) دانرا بەڕێگەی ئەهلی حەل و عەقد و ئەوان هەڵیان بژارد، یا کۆچبەران و پیشتیوانان هەڵیان بژارد و بەیعەتیان پێ داو دواتریش گشت شارەکانیش بەیعەتیان پێ دا.

وتی: قسەیەکی جوانە.

بەلاَم عومەری کوڕی خەتتاب چۆن دەسەلاَتی گرتە دەست لەرێگەی ئەهلی حەل و عەقدە وە نەبوو بەلّکو ئەبوبەکر وتی: لەدوای من عومەر خەلیفەیە، کەواتە بەدەست نیشان کردن و ناولێنان بووە، ئەمەش رێگەی دووەمە بۆ دانانی دەسەلاَتدار.

عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوای لێ بێ) بەرێگەی سێیەم هات، عومەر فەرمووی: خەلیفەی دوای من لەم شەش نەفەرە دەستنیشان دەکرێت کەپێغەمبەری خوا وەفاتی کرد لێ یان رازی بوو، کەواتە: عوسمانی کوڕی عەففان بەرێگەی ئەهلی حەل و عەقد نەبوو، بە ناولێنانیش نەبوو، بەلّکو یەك بۆ لەم شەشە هەلبژێرا.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب بەرێگەی چوارەم بوو، کاتێك ئاشوبگێڕان هاتن و گەمارۆی مالّی عوسمانیان داو شەهیدیان کرد، هاتنە لای عەلی کوڕی ئەبوتالیب و پێیان وت: خەلافەت وەرگرە، ئەو ڕەتی کردەوە، هاتنە لای زوبەیری کوڕی عەوام ڕەتی کردەوە، هاتنە لای تەلّحەی کوڕی عەبدوللاّ ڕەتی کردەوە. دواجار چونەوە لای عەلی وتیان: گەر خەلافەت وەرنەگری فارس و ڕۆمەکان خاکمان داگیردەکەن. بۆیە عەلی بەناچاری وەریگرت.

کەواتە لە ئەهلی حەل و عەقدی وەرگرت یا لەئاشوب گێران و بکوژانی عوسمانی وەرگرت لەبەر بەرژەوەندی؟.

کەواتە ئەوەی ـ کە دەڵێ پێویستە ئەهلی حەل و عەقد دەسەلآت هەڵبژێرن، و جیا لەم ڕێگەیە بەتاڵە ـ ڕاست نیە.

پێی وتم: باشە بەلآم هەڵبژاردنەکان زیانی تێدایە.

پێموت: چیە؟.

وتی: دەنگی پیاوێك وەك دەنگی ئافرەتێکە، و ئەمەش لەشەرعدا درووست نیە.

پێموت: ڕاست دەکەی.

وتی: دەنگی موسوڵمانێك وەك دەنگی مەسیحیەك وایە ئەمەش لەشەرعدا درووست نیە.

پێموت: ڕاست دەکەی[1].

وتی: جاری وا هەیە مرۆڤێك چەندین دەنگ بەپارە دەکرێت و شایستەی پۆستی سەرۆکایەتی نیە.

پێموت: ڕاست دەکەیت، وچەندین زیانی تری تێدایە.

وتی: دەی بۆچی ئەو زانایانە فەتوای دروست بوونی چوونە هەڵبژاردنەکان و هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیان داوە.

---

(١) لەگەڵ جەنابی شێخ وەحید ـ خوا بیپارێزێ ـ جیاوازم کە ژن و پیاو وموسوڵمانان و ناموسوڵمان لە دەنگداندا جیاوازن، چونکە ئەگەر دەنگداندا شایەتیدانیش بێ، هەڵبژاردن ودیاری کردنی دەسەلآتدارانی ولآت لەو بابەتانەیە کە شایەتیدانی گشت هاولآتیەکی بالغ وعاقل یەکسانە بەدەر لە ڕەگەز و ئاینەکەی.

پێموت: من پرسیارێکت لێ دەکەم: چیت لەو زانایانە دەویست؟.

وتی: دەمەوێ لەو زانایانەی کە ناسراو و بەناوبانگن وخەڵك شوێنیان دەکەوێ وخۆشیان دەوێ، وەك مامۆستا حەسان و مامۆستا یعقوب و مامۆستا حویەینی و گشت مامۆستایان بانگی خەڵك بکەن وبڵێن: ئەی گروپی موسوڵمانان هەڵبژاردن حەرامە و کەس نەچێت بۆ سەر سندوقی هەڵبژاردن، چونکە تاوانە!. لەماڵی خۆتان دانیشن، و لەخوا بپاڕێنەوە کەئاینەکەیان کەخۆی پێی ڕازییە بچەسپێنێ[1]!!.

پێموت: ڕاوەستە ژمارەی دانیشتوانی میسر چەندە؟ نەوەد و یەك ملیۆن کەسە. یەك ملیۆن عەلمانی و پێنج ملیۆن مەسیحی، ئەگەر مامۆستایان بڵێن: خەڵکینە لە ماڵەوە دانیشن و کەس نەچێ بو هەڵبژاردن ئەو کات مەسیحیەکان لەناو خۆیان کەسێکیان پاڵاوت بۆ سەرۆکایەتی و چەند کەسێکیان پاڵاوت بۆ ئەنجومەنی گەل وپێنج ملیۆنەکە دەنگیان بەسەرۆکی وڵاتدا و کەسێکی مەسیحی بو بەسەرۆك. وەزیرەکان مەسیحین،پارێزگارەکانیش مەسیحین، و ئەندامانی ئەنجومەنی

---

(١) ئایا مەنهەج و پرۆگرامی پێغەمبەر و سەلەفی ساڵح بەم جۆرە بووە، چوونەتە ئەشکەوتێکەوە و لە خواپاڕانەوە تا خوا بە هێز توانای خۆی زەوی بۆ تەخت کردوون؟! یا بە گیان و سامان بانگەواز و خەبات وجیهادیان کردووە بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی ئیسلامی.

گەلیش مەسیحین یا عەلمانین . ئەو زیانانەی کە لەمە بەدی ئەکرێ چین وچەندە؟!!.

جا ئەگەر میسر وا بێ ـ پەروەردگارمان بیپارێزی لەمەـ سەرۆکی ولآت مەسیحی بێ و پارێزگارەکانیش مەسیحی بن دۆخەکەچۆن دەبێ ؟.

کەنیسەکان بنیات دەنرێن و هەڵمەتی بە مەسیحی کردن دەست پێ دەکات وخەڵکیش بە یاسا دەبنە مەسیحی، کوڕی تۆش دەبێتە مەسیحی و ناشتوانی بڵێی نەخێر.

ئەو کات ئیسلام و مەسیحی بە یاسا و ئازادی یەکسان دەبن، و پارە دەدرێتەخەڵك بۆ ئەوەی ببنە مەسیحی، و مەسیحیەت تەشەنە دەکات و بلآو دەبێتەوە، ئەو کات لێتان دەپرسین: ئایا دروستە لە دە سەلاتدار یاخی بی، چونکە مەسیحیە. تۆش دەڵێی: بەڵێ یاخی بوون درووستە چونکە مەسیحیە و موسوڵمان نیە، تەواو .

کەواتە: دەچیتە ئاشوبێکی ترەوە، چی دەڵێی؟.

سوێند بەخوا ئاشوبی زۆر گەورەی تێدایە لە وانەیە لێی دەرنەچن، و لە ژێر دەسەلآتی مەسیحیەکان دەمێننەوە.

پێموت: ئەم قسەیەی تۆ دەیکەیت ئەو مامۆستا و زانایانە بیریان لێکردوەتەوە و بینویانە کەزیانی گەورەی تێدایە بۆیە رێیان بەخەڵك داوەبچن بۆ هەڵبژاردن بۆ ئەنجام دانی زیانێکی کەمتر، کەچوونە بۆ سەر سندوقی دەنگدان,لە گەڵ ئەوەی کە

زانیویانە ئەمە ئامرازێکی شەرعی نیە، بۆ هەڵگرتنی زیانێکی گەورەتر، کە وەرگرتنی دەسەڵاتەلە سەر ملی موسوڵمانان لەلایەن مەسیحیەکان.

جا تۆ چی دەڵێی؟.

وتی: ڕاست دەکەی و من گەڕامەوە بۆ لای خوای گەورە و تۆبەم کرد لەم فیکر و بیر و بۆچونە و پەیمانت پێ ئەدەم جارێکی تر نەچمەوە لایان(واتە مەدخەلییەکان).

بەڕاستی پیاوێکی بەویژدان بوو، خوا پاداشتی خێری بداتەوە[١].

کۆتایی ئەم گفتو گۆیە بە تەوبە و پەشیمان بوو نەوەی ئەو بوو[٢].

(وصلى الله وسلَّم على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين)

---

(١) بێگومان هەر مرۆڤێك بەدوای ڕاستی بگەڕێ و وێژدان وئینسانی هەبێ، ودوور بێ لە دەمارگیریێ و ئارەزوو لە ئەنجامدا خوای گەورە ڕێنومایی دەکات - وەك ئەم برا بەڕێزە - بۆ هەق وڕاستی.

(٢) پڕ بە دڵ و لە ناخەمەوە ئەپاڕێمەوە کە خوای گەورە هیدایەتی ئێمە ئەو برایانە بدات بۆ ڕێگای ڕاست و بۆچوونی درووست و بمانبارێزێ لە دژایەتی یەکتر و باسکردنی پاشەملێ و تانە و تەشەردان و خۆخۆری و سەرقاڵبوون بە کەمو کوڕی یەکتر، بە دۆستگرتنی کەسانی عەلمانی و دژ بە ئاین لەجێی دۆستایەتی و برایەتی ئیمانداران.

# ناوەڕۆک



| | |
|---|---|
| پێشەکی | ٥ |
| دەروازە | ٨ |
| بابەتی یەکەم: یاخی بوون لە دەسەلآت | ١٥ |
| بابەتی دووەم: دیموکراسی | ٣٨ |
| بابەتی سێیەم: حیزبایەتی | ٤٥ |
| بابەتی چوارەم: هەڵبژاردن | ٥٥ |
| ناوەڕۆک | ٥٦ |

خوێنەری بەڕێز ...

ئەم پەڕاوەی لە بەردەستە گفتوگۆیەکی زانستیانەیە لە نێوان زانایەکی سەلەفی بە ناوبانگی میسری شێخ وەحید بالی - خوا تەمەنی درێژ کات. لەگەڵ برایەکی بەرێزی ڕەوتی سەلەفیەکی مەدخەلی - خوا پاداشتی بداتەوە- لە سەر چوار تەوەری گرنگ و هەستیارە کە زۆر جار ئەم ڕوەتە خەڵکی پێ سەرقاڵ دەکەن:

**١- یاخیبوون لە دەسەڵاتدار** **٢- دیموکراسی**

**٣- حیزبایەتی** **٤ - هەڵبژاردن**

لە ئەنجامدا و پاش گفتوگۆیەکی زانستی دوور و درێژ ئەم برایە دان بە ڕاستی بۆچوونەکانی شێخ وەحید بالیدا دەنێو پەشیمانبوونەوەی خۆی لە فیکر و بۆچوونی ڕەوتی مەدخەلیەکان ڕادەگەیەنێ و تۆبە دەکات.

شێخ وەحید بالی لە یەکێك لە مزگەوتەکان ئەم گفتوگۆیەی کە ئەنجامی داوە بە ئەمانەتەوە بۆ دەستەیەك لە قوتابیانی دەگێڕێتەوە و بە ڤیدیۆ تۆمار کراوە.

"وەرگێر"